# عائيشه پێشەوای ئافرەتانی ئوممەت

ناوی : عائیشەی کچی ئەبوبەکرە .

کچی پێشەواو خەلیفەی ئوممەت **أَبِي بَكْرٍ عَبْدِ اللهِ بنِ أَبِي قُحَافَةَ عُثْمَانَ بنِ عَامِرِ بنِ عَمْرِو بنِ كَعْبِ بنِ سَعْدِ بنِ تَيْمِ بنِ مُرَّةَ بنِ كَعْبِ بنِ لُؤَيّ ، قورەیشی ، تەمیمی ، مەککیە .**

دایکی ئیماندارانە و خێزانی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم

زەهەبی دەڵێ : تێگەیشتووترین ئافرەتی ئوممەتە .

**ناوی دایکی :**

أُمُّ رُوْمَانَ بِنْتُ عَامِرِ بنِ عُوَيْمِرِ بنِ عَبْدِ شَمْسِ بنِ عَتَّابِ بنِ أُذَيْنَةَ الكِنَانِيَّةُ .

ساڵی لەدایك بوونی دایکی ئیمانداران عائیشە لە نێو ئیسلام بووە ، هەروەها لەڕووی تەمەنەوە **هەشت** ساڵ بچووکتر بووە لە فاتیمەی کچی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم .

دایكـــــــی ئیمانـــــــداران عائیشــــــه‌ له‌ڕووی ڕه‌نـــــــگ و ڕووخساره‌وه‌ ئافره‌تێكی **سپی جوان** بوو .

خۆشه‌ویســـــترین خێزانه‌كـــانی پێغه‌مــــبه‌ر صـــلی الله علـــیه وســـلم بوو ، له‌هه‌موویانی زیاتر خۆش ویستوه‌ .

له‌هه‌مـــــوو خێزانه‌كـــانی تـــری تێگه‌یشـــتوو تـــر بــــووه‌، به‌ڵكـــو له‌هه‌مــــوو ئافره‌تـــانی ئـــوممه‌ت تێگه‌یشـــتووتر و زاناتر بووه‌ .

تـــاكه‌ خێـــزان بـــووه‌ له‌نێـــو هه‌مـــوو خێزانه‌كـــانی پێغه‌مـــبه‌ر صـلی الله علـــیه وسـلم كه‌وا **كـــچ** بـــووه‌ ، ئه‌وانـــی تـــر هه‌موویـــان بێوه‌ژن بوون ! .

## چ كاتێک پێغه‌مبه‌ر صلی الله علیه وسلم ماره‌ی بڕی

له‌دوانـــی وه‌فـــاتی دایكـــی ئیمانـــداران خه‌دیجه‌ـــی كچـــی خوه‌یلیـــد مـــاره‌ی بـــڕی ، ئه‌مه‌ش پـــێش ئه‌وه‌ی كـــۆچ بكـــات بـــۆ مه‌دینـــه‌ به‌ مـــاوه‌ی زیـــاتر له‌ دوومانـــگ پـــێش وه‌قـــت ، وه‌ ده‌ڵێن : دوو ساڵ

پێش ئه‌وه‌ی كۆچ بكات بۆ مه‌دینه‌ ماره‌ی بڕیوه‌ .

## چ کاتێك عائیشەی گواستەوە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم

دوای ئەوەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دایکی ئیمانداران

**عائیشە** مارە دەبڕێ لە مەککە ، دواتر دەیگوازێتەوە لە مانگی

**شەوالی ساڵی دووی کۆچی** دوای گەڕانەوەیان لە جەنگی بەدر .

## تەمەنی دایکی ئیمانداران عائیشە چەند بوو

ڕاسترین و درووسترین ڕا لەگەڵ ئەوەیە دایکی ئیمانداران عائیشە

تەمەنی **نۆ** ساڵ بووە ، واتە لە تەمەنی **حەوت** ساڵی مارەی بڕیوە،

لەتەمەنی **نۆ** گواستوویەتیەوە .

لەبارەی تەمەنیەوە ڕەخنەیەکی زۆر لەلایەن دڵنەخۆش و دوو ڕووەکان گیراوە لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ، بەوەی

منداڵێکی هێناوە ، هەروەها هەندێ لە نەزانەکانیش بۆ ڕازی کردنی دڵی دوو ڕوەکان دەڵێن : نەخێر نۆ ساڵ نەبووە بەڵکو

هەژدە ســــاڵ بـــووە ، بەڵام هەمـــــوو بەڵــــگە ڕاســـت و درووســــتەکان ئەوە دەســـەلمێنن کەوا نـــۆ ســـاڵ بـــووە نەك هەژدە ساڵ .

## بەڵگەی سەلمێنەر بۆ بچووکی دایکمان عائیشە

عَـــنْ عَائِشَـــةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَـا): أَنَّهَـــا كَانَـــتْ تَلْعَـــبُ بِالْبَنَـــاتِ عِنْـــدَ رَسُـــولِ اللَّهِ صـــلى الله علـــيه وســـلم قَالَـــتْ: وَكَانَـــتْ تَـــأْتِينِي صَـــوَاحِبِي فَكُـــنَّ يَـــنْقَمِعْنَ مِـــنْ رَسُـــولِ اللَّهِ صـــلى الله علـــيه وســـلم قَالَتْ: فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يُسَرِّبُهُنَّ إِلَيَّ.[1]

لـــە عائشـــەوە (خـــوای لـــێ ڕازی بێـــت) کـــە ئـــەو یـــاری بەبووکـــە شووشـــە دەکـــرد لای پێغەمبـــەر صـــلى الله علـــيه وســـلم دەڵـــێ: چەنـــد هاوڕێیـــەکم هـــەبوون دەهـــاتن بـــۆلام، کـــاتێ پێغەمبـــەریان صـــلى الله علـــيه وســـلم دەبینـــی خۆیـــان دەشـــاردەوە لەشـــــەرمدا، پێغەمبـــــەریش صـــلى الله علـــيه وســـلم یەکەیەکـــــە دەینارد‌نەوە بۆ لام.

[1] صحيح البخاري ٦١٣٠ وە مسلم ٢٤٤٠ وە أبو داود ٤٩٣١ وە ابن ماجه ١٩٨٢ وە النسائي ٣٣٧٨ .

- دەڵێم :

ئەم فەرمـــــــــوودە بەڵـــــــگەی ئەوەیە كاتێـــــــك خێزانـــــــی پێغەمـــــبەر صـــلى الله علـــيه وســـلم بـــووە زۆر بچـــووك بـــووە ، وە هەروەها منداڵیش

بـــووە ، چـــونكە یـــاری بە بـــووكەڵە كـــردووە و لەگەڵ منداڵان یاری

كـــردووە ، كەواتە شـــتێك شـــەرعی بـــێ و حـــوكمی الله بـــێ بـــۆچی موســـڵمان شـــەرمی لێبكـــات بەوەی ڕوویـــداوە ، یـــان بۆچی گوێ ڕایەڵ نەبێ .

## هۆكاری هەڵبژاردنی دایكی ئیمانداران

عَـــنْ عَائِشَـــةَ (رَضِيَ اللَّه عَنْهَـا) أَنَّهَـــا قَالَـــتْ: قَـــالَ رَسُـــولُ اللَّهِ صـــلى الله علـــيه وســـلم: (أُرِيتُـــكِ فِـــي الْمَنَـــامِ ثَـــلاَثَ لَيَـــالٍ، جَـــاءَنِي بِـــكِ الْمَلَـــكُ فِـــي سَـــرَقَةٍ مِـــنْ حَرِيـــرٍ فَيَقُـــولُ: هَـــذِهِ امْرَأَتُـــكَ، فَأَكْشِـــفُ عَـــنْ وَجْهِـــكِ، فَـــإِذَا أَنْـــتِ هِـــيَ، فَـــأَقُولُ: إِنْ يَـــكُ هَـــذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ يُمْضِهِ.[2]

لە(عاشـــە)وە (خـــوای لـــێ ڕازی بێـــت) دەڵـــێ: پێغەمبـــەر صـــلى الله علـــيه وســـلم فـــەرمووی: (ســـێ جـــار تـــۆم نیشـــاندرا

[2] صحيح البخاري / النكاح/ ٤٨٣٢ . مسلم فضائل الصحابة ، والترمذي ٣٨٨٠

لەخـــــەودا، فریشـــــتەیەك تـــــۆی دەهێنـــــا بـــــۆلام لـــــەناو پارچەیـــــەك ئاوریشـــــمدا دەیـــــوت: ئەمـــــە خێزانەكەتـــــە لـــــە دەموچـــــاوت وردەبمـــــەوە تـــــۆ ئـــــەویت، منـــــیش دەمـــــوت: ئەگەر ئەم خەوە لەخواوە بێت دەیهێنێتە دی.

- **دەڵێم :**

لێـــــرەوە بۆمـــــان دەردەكەوێ كەوا دایكـــــی ئیمانـــــداران خـــــاوەن پلەیەكـــــی زۆر تـــــایبەت بـــــووە ، چـــــونكە لەلایەن خوای تەعالاـەوە دیاری كراوە

**لەبەر ئەوەی خەوی پێغەمبەران ڕاستە .**

ئەوەـــــی گـــــرنگە ئەو بەڵگـــــانەی بچـــــووكی تەمەنیەتـــــی پێویســـــتە ئێـــــوە جـــــوان بیـــــزانن و خەزنـــــی بـــــكەن بـــــۆ ڕەددانەوە .

**هەروەها وەکو شەرع :**

بەهیچ جۆرێك تەمەن بۆ پیاو و ئافرەت پێوەر نیە و نابێتە ڕێگر .

ئینجا بچووکتر بێ زۆر وەکو دایکمان عائیشە

یان گەورەتر بێ زۆر وەکو دایکمان خەدیجە

ئەوەی گرنگە بیروباوەڕ و دین و عیلم و ڕەوشتە .

سەیرکەن تا ئێستا خەڵکی گومڕاو دڵنەخۆش ڕەخنە لەوە دەگرن کەوا پێغەمبەرێك منداڵێکی هێناوە .

**بەڵام نازانن ئەم منداڵە لەژێر دەستی ئەم پێغەمبەرە بوو بە قدوەو پێشەوای هەموو ئافرەتانی ئوممەت** ، بوو بەبەشێك لەعیلم ، چونکە لە لای کەسێکی وا ژیاو پەروەردە بوو

کەواتە زۆر گرنگە ژینگەی ژیان بۆ پیاو و بۆ ئافرەت .

چونکە هەرچەند شارەزا بی و عیلم بزانی پیاو جاهیل بی و نەزان سوودی نابێ و پەروەردەکەت هەڵدەوەشێتەوە .

## ئەوكاتەی دایكمان عائیشه توڕه بووایه

عَـنْ عَائِشَــةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَـتْ: قَـالَ لِـي رَسُـولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم: (إِنِّي لأَعْلَمُ إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً، وَإِذَا كُنْتِ عَلَيَّ غَضْبَى). قَالَتْ: فَقُلْتُ: وَمِنْ أَيْنَ تَعْرِفُ ذَلِكَ؟ قَالَ: (أَمَّا إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً فَإِنَّكِ تَقُولِينَ: لَا وَرَبِّ مُحَمَّدٍ صلى الله عليه وسلم ، وَإِذَا كُنْتِ غَضْبَى قُلْتِ: لَا وَرَبِّ إِبْرَاهِيمَ). قَالَتْ: قُلْتُ: أَجَلْ -وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ- مَا أَهْجُرُ إِلَّا اسْمَكَ.[3]

له(عائشه)وه (خوای لێ ڕازی بێت) پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی وتم: من دەزانم چ كاتێك تۆ لێم ڕازیت، و چ كاتێك لێم زویریت) دەڵێ: پێم وت: لەكوێوه ئەمه دەزانی؟ فەرمووی: (بەوەی هەركات لێم ڕازی بوویت دەڵێی: نەخێر بەخوای محمد صلى الله عليه وسلم و هەركات لێم زویر بوویت دەڵێی: نەخێر بەخوای إبراهیم) دەڵێ: وتم: بەڵێ -والله ئەی پێغەمبەری خوا -تەنها ناوەكەی تۆ وازلێ دێنم).

[3] موسلیم ٢٤٣٩ ، وه بوخاری ٦٠٧٨ ، وه مسند احمد ٢٤٠١٢ .

- **ده‌ڵێم :**

ئه‌مه ســــــــیفه‌تێکی زۆر جـــــــوان و ڕه‌وشــــــــتێکی به‌رزی دایکــــــی ئیمانـــــــدارانه ، به‌وه‌ی له‌کـــــاتی تـــــۆڕه‌یی و دڵ ڕه‌نجـــــانیش پـــــێگه‌ی مێـــــردەکه‌ی که‌وا پێغه‌مـــــبه‌ری الله یه **له‌بیــــر نه‌کـــــردووه** ، جـــــگه له‌وه‌ش پێویســـــته ئـــــافره‌تی موســـڵمان به‌و شـــێوه بـــێ ، نه‌ك گه‌ر بێـــت و بیســـت ســـاڵ پیـــاوه‌که‌ی چـــاکه‌ی به‌رامـــبه‌ری هه‌بـــێ ته‌نهـــا یه‌ک شـــتی لێببینـــێ ، ڕاســـته‌وخۆ ده‌ڵـــێ : **قالـــت مـــا رأيـــت منـــك خيـــرا قط**.

هه‌رگیـــز خێـــرو چـــاکه‌م لێـــت نه‌دیـــوه ، ئه‌وه فه‌رمـــووده‌یه و شـــــــاهێده له‌ســـــــــه‌ر ئه‌وه‌ی کـــــــاتێ له‌ڕۆژی جه‌ژن پێغه‌مــــــبه‌ر صـــلى الله علـــيه وســـلم ده‌چێـــــته لای ئافره‌تــــان و ئامۆژگاریان ده‌کات و پێیان ده‌ڵێ:

له‌خوابترســــــن و خێــــربکه‌ن ، چــــونکه مـــــن بینـــــیم زۆریــــنه‌ی ئه‌هلـــی ئـــاگر ئافره‌تـــان بـــوون ، گووتیـــان : بـــۆچی ؟ فه‌رمــــووی : له‌به‌ر ئه‌وه‌ی نـــا سووپاســــگوزارن به‌رامـــبه‌ر پیاوه‌کانیـــان ، ئینجـــا ئه‌م فه‌رمــــووده‌ی گـــووت .

بـــۆیه پێویســـته ئافره‌تـــان ئه‌م خاڵایـــان له پـــێش چـــاو بێـــتن ، که‌وا به‌هۆیه‌وه گوناهیان بۆ ده‌نووسرێ .

## خەڵکی بەهۆی عائیشەوە خۆیان خۆشەویستدەکرد

عَـــنْ عَائِشَـــةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَـا): أَنَّ النَّـــاسَ كَـــانُوا يَتَحَـــرَّوْنَ بِهَـــدَايَاهُمْ يَـــوْمَ عَائِشَـــةَ، يَبْتَغُـــونَ بِـــذَلِكَ مَرْضَـــاةَ رَسُـــولِ اللَّهِ صـلى الله علـيه وسلم 4.

لـــه (عائشـــه)وه (خـــوای لـــێ ڕازی بێـــت) کـــه خـــەڵك بـــەدوای ئـــەوەدا دەگـــەڕان لـــه ڕۆژی عائشـــەدا دیاریـــەکانیان بنێـــرن، مەبەســـتیان ئـــەوە بـــوو پێغەمبـــەر (صلی الله علیه وسلم) پێی ڕازی و دڵخۆش ببێ.

- **دەڵێم :**

چـــونکه شـــتێکی شـــاراوه نەبـــوو ، لای خێزانەکـــانی تـــری پێغەمـــــــبەر صـــــلی الله علـــــیه وســـــلم و خەڵکـــــــیش ، واته : هـــــاوەڵانیش درکیـــــان بەوه کردبـــــــوو کەوا دایکـــــــی ئیمانـــداران **عائیشـــه** تـــایبەت تـــرین خێزانـــی پێغەمـــبەر بـــوو ، وه لەهەموویانیشـــی زیـــاتر خۆشـــتر دەویســـت ، کەواته لێـــــره خاڵێـــــك هەیه ، گەر بێـــــت یەکـــــێ بڵـــــێ پێویســـــته بـــــۆ هێنـــــانه کـــــایەوەی دادپەروەری لەنێـــوان خێزانەکـــــان هەمـــــــووانی وەکـــــو یەك بـــــێ جیـــــاوازی خۆشـــــــــبوێ ، ئەوا **نەیپێکـــــــاوه** ، چـــــــونکه عەدالەت پەیوەســـــــت نـــــــیه بەوەوه ، وەکـــــــو ئەو نمـــــــونەی کەوا هێنامـــــانەوه کەوا پێغەمـــــبەر صـــــلی الله علـــــیه وســـــلم خێزانەکـــــانی له .

4 بوخاری ٢٥٧٤ ، موسلیم ٢٤٤١ ، وه نەسائی ٣٩٥١ .

## فەزڵ و پێگەی دایکمان عائیشه

عَـنْ أَبِـي مُوسَـى (رضي الله عنـه) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّهِ صـلى الله علـيه وسـلم: (كَمَـلَ مِـنَ الرِّجَـالِ كَثِيـرٌ، وَلَـمْ يَكْمُـلْ مِـنَ النِّسَـاءِ غَيْـرُ مَـرْيَمَ بِنْـتِ عِمْـرَانَ، وَآسِـيَةَ امْـرَأَةِ فِرْعَـوْنَ، وَإِنَّ فَضْـلَ عَائِشَـةَ عَلَـى النِّسَـاءِ كَفَضْـلِ الثَّرِيـدِ عَلَـى سَـائِرِ الطَّعَامِ).[5]

لـە(أبی موسـی)وە (خـوای لـێ ڕازی بێـت) دەڵـێ: پێغەمبـەر صـلى الله علـيه وسـلم فـەرمووی: (پیـاوان **زۆریـان** لێکامـڵ بـوون، بـەڵام ئافرەتـان کاملێـان **تیانـەبووە**، جگـە لـە (مـریم ی کچـی عیمـران) و (ئاسـیەیی خێزانـی فیـرعەون)، بەڕاسـتی ڕێـزی **عائشـە** بەسـەر ئافرەتـانی تـردا، وەك ڕیـزی شلەبەگۆشـت وایـە بەسـەر خواردنەکانی تردا.

عـن عَائِشَـةَ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهَـا زَوْجَ النَّبِـيِّ صـلى الله علـيه وسـلم قَالَـتْ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّهِ صـلى الله علـيه وسـلم: (يَـا عَـائِشُ، هَـذَا جِبْرِيـلُ يَقْـرَأُ عَلَيْـكِ السَّـلَامَ). قَالَـتْ: فَقُلْـتُ: وَعَلَيْـهِ السَّـلَامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، قَالَتْ: وَهُوَ يَرَى مَا لَا أَرَى.[6]

دایکمـان عائیشـە دەڵـێ: پێغەمبـەر صـلى الله علـيه وسـلم فـەرمووی: (ئـەی عائشـە ئـەوە (جبریل)ـە سـەلامت

---

[5] البخاري ٣٢٣٠ و مسلم .
[6] البخاري ٣٥٥٧ ومسلم .

لێدەکات وتی: (و علیه السلام ورحمه الله) ئەو شتی وای دەبینی من نەمدەبینی. مەبەستی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم .

## دایکی ئیمانداران عائیشه خۆشەویسترین ئافرەت بوو لای

له عَمْرِو بنِ العَاصِ: أَنَّهُ قَالَ لِرَسُوْلِ اللهِ - صلى الله عليه وسلم -: مَنْ أَحَبُّ النَّاسِ إِلَيْكَ؟

قَالَ: (عَائِشَةُ) .

قَالَ: مِنَ الرِّجَالِ؟

قَالَ: (أَبُوْهَا). [7]

عەبدوللّەی کوڕی عەمری کوڕی عاس دەڵێ :

بە پێغەمبەری فەرموو صلى الله عليه وسلم ، کێ خۆشەویسترینی خەڵکە لات ؟

گووتی: عائیشه .

دەڵێ : ئەی لەپیاوان

فەرمووی : باوکی واتە : ( أبو بکر ) .

[7] هَذَا حَدِيْثٌ صَحِيْحٌ. ترمذي ٣٨٨٦ .

- **ده‌ڵێم :**

ئه‌مه‌ش ده‌لالـه‌ته لـه‌وه‌ی ده‌ربڕینـــــی خۆشه‌ویســـــتی پیـــــاو بـــۆ یه‌کـــی له‌خێزانه‌کـــانی ئاســـاییه ، هه‌روه‌هـــا په‌یوه‌ســـت نیه به‌لایه‌نی

**دادپه‌روه‌ری نێـــوان خێزانه‌کـــان** ، بچـــوکترین خێزانـــی بـــوو ، به‌ڵام خۆشه‌ویســـترین خێزانـــی بـــوو ، چـــونکه زۆرێـــــك وا گومـــــان ده‌به‌ن به‌وه‌ی پیـــــاو نـــــاتوانێ له‌ڕووـــــی خۆشه‌ویســـــتیه دادپه‌روه‌ر بـــــێ و هه‌مـــــووی وه‌کـــــو یه‌ك خۆشـــــبوێ ، بۆنمـــــونه : خۆشه‌ویســـــترین خێزانـــی عائیشـــه بـــوو ، به‌ڵام تاوه‌فـــاتی کـــرد به‌رده‌وام نـــاوی دایکـــی ئیمانـــداری به‌ڕێـــز ( خه‌دیـــجه‌ی کچـــی خوه‌یلـــد ) ، ده‌هێنـــا واته : وه‌فـــاو ســـۆزی بـــۆی هه‌بـــوو ، ســـبحان الله ســـه‌یری گه‌وره‌یـــی پێغه‌مـــبه‌ری به‌ڕێزمـــان بکه‌ن.

به‌و شـــــێوه بـــــوه له‌ڕووی مـــــامه‌ڵه‌وه له‌گه‌ڵ خێـــــزانه به‌ڕێزه‌کـــــانی ، نه‌ك وه‌کـــــو ئه‌وانه‌ی ئه‌مـــــڕۆ که‌وا ته‌مســـیلێکی ناشـــرینی ئیســـلامیان کـــردوه. که‌وا به‌هـــیچ جۆرێك ئیسلام به‌و جۆره په‌روه‌ده‌مان ناکات .